بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الحَمْدَ للّهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفَِرُهُ، ونَعوذُ باللّهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللّهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللّهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللّهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ .

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيرَاً ونِساءً واتَّقُوا اللّهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللّهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً.

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللّهَ وقُولوا قَولاً سَديدَاً، يُيصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللّهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزَاً عَظيماً..

أمَّا بعدُ: فإنَّ اصدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللّهِ، وخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمدٍ ﷺ، وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ،وكُلَّ ضَلالَةٍ في النَّارِ

## وریابە ژیانی دنیا هەڵت نەخەڵەتینت

باکەمێک بچین لەژیانی دنیا ڕابمێنین ،ئەو ژیانەی هەموو خەلکی بەخۆیەوە سەرقاڵکردوە ، کەوا پەی دەبن کە ئەم ژیانە بێ کۆتاییە ، ئەمەش بەهۆی هەڵخەلتان بە خانوی بەرز بەسەیارەی مۆدیل بەرزە بەژنی جوان ! بەزۆر شتی تر کەوای لێ کردون بۆدنیابژین و قیامەت و گەرانەوە بۆلای خوای گەورە لەبیر بکەن ! ( یَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ)(7)الروم . واتە: ئەو جۆرە کەسانە تەنها شارەزان بەژیانی دنیا ، لە بەرامبەر قیامەتیشەوە بێ ئاگان . بەڕاستی زۆر سەیرە بۆکەسانێک کە لەڕاستی ئەم دنیایە تێ ناگەن وادەزانن هەرلەم دنیایە ئەمێننەوە بۆیە هەموو هەوڵێکیان تەنها بۆژیانی دنیایە واتە کەسانێکن بۆخوا ناژین تەنها دونیا ویستن ! بەڵام موسڵمانی ڕاست گۆ و شوێن کەووتەی پێغەمبەری نازدار (ﷺ) دەزانێ ژیانی دنیا چۆنە بۆیە تەنها بۆقیامەت هەوڵدەدات کەژیان بەسەر بردن لەدوارۆژ بۆیەکجاریە . خوێنەران- وەرن بالەوساتەوە بۆخوا بژین بەڕاستی سەرفرازی هەردوو دنیا ئەبین . چونکە

ئەم ژیانەی دنیا هەموو وەکو یەک ڕۆژە هەموو شتەکانی دووبارە دەبنەوە ،

هیچ ناگۆڕێ تەنها تەمەنمان کەم دەبێتەوە بەرەو مەرگ هەنگاو دەنێن ، کەمێ بیربکەوە لەژیانی ئەم دنیایە کە بەیانی دێ و دوای نیوەڕۆ دێ و ئێوارە دێ شەو دەخەوی بۆ بەیانی شتەکان دوبارە دەبنەوە سبحان اللە !! ئائەمەیە ژیانی دنیا واللە هەرکەس ڕوو لەدنیا و خۆشییەکانی بکات هیچ کات خێرو خۆشی لەخۆی نابینێ . بێگومان تەنها بۆخوا ژیان گرنگە . لەم دنیاییە واتە بۆخوا بژی فەرمانەکانی جێبەجێ بکەی و گوێڕایەڵی پێغەمەری خوا (ﷺ) بین ئەوکات سەربەرز دەبین و ژیانێکی بەختەوەرمان بۆدەبێ لەدنیا ، پاشان لە قیامەت پاداشتێکی نەبڕاوەمان دەبێتە نسیب ، بەلام بەپێچەوانە هەرکەس پشت لەیاد و بەرنامەی خوابکات لەژیانی دنیا بێگومان ناخۆشی و خەم دەردەسەری بۆدەبێ لەژیان بەهۆی پشتکردنی لە دینی خوا.

(وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى)(124)طه. واتە:ئەوەیش ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین. بەڕاستی لەم ڕۆژگارەی غوربەتی ئیسلام مرۆڤەکان هەر خەریکی ئەوەن

ژیانی خۆیان خۆش بکەن دووربن لەناخۆشی هەموو هەولێک ئەخەنەگەڕ تابەس بەخۆشی بژین !
بەلام بەڕاستی ئەم خەلکە زۆر سەیرن هەموو هەوڵو ماندوو بونێکیان بۆ دنیایەکە کەمانەوەیان کاتیە ! چەن ساڵێک ئەمێنیەوە دواتر مردن بەرۆکیان ئەگەرێت بەرەو دونیای ئەبەدیا ئەبات ! بەلێ ئەی خوێنەرانی بەرێز بۆچی کەمێکیش بۆ خوا خۆت ماندوو ناکەی تا لەو دنیا کاتیە بەهەشتێکی هەتاهەتایت پێ بدات ! بەڕاستی لەم سەردەمەدا موسڵمان زۆر گۆڕاون ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو خراپی ئەڕۆن دڵ یان لاواز دەبێ بۆبەرنامەی خوا، تەنها بەرەو دنیا ئەڕۆن نازانن دنیاش زۆر بێ وەفایە هەر لەتەمەنیان کەم دەکاتەوە ! زۆرمنداڵ و گەنجی نازداری پیرکرد سەرنجام لاشەکەیانی کرد بەخۆراکی حەشەڕاتی ژێر گۆڕ! بۆیە وریابە ژیانی دنیا هەڵتنەخەلەتێنێت .
(فَلا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا) (5)فاطر.واتە: جا با ژیانی ئەم دونیایە نەتانخەڵەتێنێ و چەواشە نەبن پێی . خوێنەری بەڕێز- ئێمە ژیانی دنیا مان بۆ ڕوون بوو یەوە کە چیە و چۆنە وە بۆچی هاتوینەتە ئەم ژیانە ، بەڵام بۆزیاتر شیکردنەوە بابگەڕێنەوە بۆ لای قورئانی پیرۆز ، خوای گەورە دەفەرموێ: (الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا) (2)الملک . واتە: ئەو خوایە کە مردن و ژیانی دروستکرد،

ئەوەتە هەندێ ئەژێنێ، هەندێ ئەمرێنێ، خۆ مردنیش گواستنەوەیە لەجێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر،

پاشان لەجێگای دووەمدا ژیانێکی نوێ دەست پێ ئەکاتەوە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامەتان کارو کردەی چاکترو باشترە، پاشانیش بەپێی ئەوە پاداش وەرگرێتەوە . برای ئازیز خوشکی بەڕێز دەبێ بزانین خوای پەروەردگار ئەم دنیاییەی بۆتاقیکردنەوەی بەندەکانی دورستکردووە ، واتە ژیانێکی کاتی و مانەوەی هەتا سەر نیە. لەبڕی ئەم دنیایە خوای تاقانە ژیانێکی تری دروستکردوە ، کەمانەوە لەو دنیا بێ کۆتاییە واتە هەتاییە .بۆیە خوای گەورە لەوەسفی ئەم ژیانەی دنیا دەفەرموێ: (إِنَّمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ) (39)الغافر. واتە: ژیانی ئەم دنیایە تەنها بریتیە لە ڕابوردنێکی کەم، بەڕاستی ژیانی پاشە ڕۆژ و داهاتوو، هەر ئەو شوێنی ئومێد و ئارام گرتن و حەسانەوەیە . تێبگەو بیربکەرەوە ئەی بەندەکانی خوا قیامەت مەدۆڕێنە بەم ژیانەی دنیا بەڕاستی پاشە ڕۆژ هەرخۆت زەرەر دەکەی بەهۆی پشتکردنت لەبەرنامەی خوای گەورە . جا ئەوکەسانە عەزابێکی سەختیان بۆهەیە لەدوارۆژ بەهۆی ئەوەی ژیانی دنیایان کڕی بەژیانی دوارۆژ ، سنورەکانی خوای پەروەردگاریان دەبەزاند و بۆ ئارەزووی نەفسی خۆیان دەژیان . (أُولَٰئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ) (85)البقرة. واتە: ئەوانە

کەسانێکن ژیانی قیامەتیان بە ژیانی ئەم دنیایە داوە لەبەرئەوە هیچ کات سزایان لێ سووك وکەم ناکرێتەوە لەلایەن هیچ کەسێکیشەوە هاوکاریی ویارمەتی نادرێن، تا لێی ڕزگاربن . بەڵێ براو خوشکانم دەبێ ئامانجمان لەژیانی دنیا تەنها رازی بونی خوای گەورە بێت بەڵام دەبێت بزانین لە دونیادا هەول و کۆشش و ماندوو بوونی بێ وەچانی دەوێت، بۆ رازی بوونی خوای گەورە وە بەدەسهێنانی بەهەشت.

هەر وەک چـــۆن قوتـــابی لە قوتابخـــانە تێدەکۆشـــێ بـــۆ دوارۆژێکی

گەش و بەدەســـــت هێنـــــانی ئامـــــانجەکەی بـــــۆ (دکتۆر،مامۆســـتا،ئەندازیار ....هتـــد). خەمـــی ســـەرەکی بەدەســـت هێنـــانی نمـــرەی بەرزە بـــۆ مســـۆگەر کردنـــی مەبەســـتەکەی! بەڵام بە دەســـت هێنـانی ڕەزامەنـدی خـوا پاشـان بەهەشـت ئامانجێکە بۆ گشـت مرۆڤێکی موسڵمان دەبێ هەولی بـۆ بـدات شـەونخونی بـۆ بکـات تـا وەدەسـت بێنێت، بەڵام لەم ڕۆژگارە خۆشیەکانی دنیا وای کـردووە کە موسـڵمان هەمـوو کارێکی تەنهـا بـۆ دنیـا بێ هەر وا گومـان دەبەن ژیـان بەسـەر بردن لە دنیا بۆ یەکجـارییە بـۆیە بەس بۆ ڕابواردن و پشتکردن لە بەرنامەکەی خوا دەژین.

( أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ)(115)المومينون.واته: ئايا گومانتان وادەبرد کە بە ڕاستی ئێمە ئێوەمان بە بێ مەبەست دروست کردووەو ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە؟!
جا ئەوەی گرنگە لەم ژیانە کۆکردنەوەی تێشووە بۆ دنیای ئەبەدی کە قیامەتە . تۆ ڕێبواری دەتئەوێ بڕۆی بۆشارێکی دوور گەڕهاتوو شتی پێویستت لٚەگەل خۆت نەبرد بۆ ئەم سەفەرە وەک: ئاو ، خواردن ..هتد بێگومان لەڕێگادا نەجاحەت نایەنیت بەهۆی دووری ڕێگاکە و برسیەتی و تێنویەتی ، توشی ناخۆشی و نارحەتی و ماندوو بون و تیاچوون ئەچی ، جابرا و خوشکانی بەڕێزم تۆش لە دنیا هەر وەک ئەم ڕێبوارەی کەسەفەرێکیت لە پێشە دەبێ بێگومان کۆچی بۆبکەی کە قیامەتی نەبڕاوەیە . باشترین خۆراک و خواردنەوە بۆئەم سەفەرە کۆکردنەوەی تێشووە کە بریتیە لە خواترسان و چاکەکردن .
(وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ)(197)البقرة .
واتە: بەردەوام هەوڵ بدەن کە زەخیرەو توێشوو هەڵبگرن بێگومان چاکترین زەخیرەش تەقواو پارێزکاریە، بەردەوامیش لە من بترسن ئەی خاوەن بیرو هۆشەکان .
کەس قەدری دنیا نازانێت جگە کەسانێکی لەخواترس چونکە باش لەدنیا گەیشتوە ، پاشان مامە حاجی یەکی پیر کە سەرو ڕیشی سپی بوە ! کە کاتی خۆی گەنجی مەیدان

بوو لە جوانی ناوبانگ دەولەمەندی ماڵ و مندال لەهیچی کەم نەبوو ، بەڵام دنیا ڕۆژبەڕۆژ ڕۆژگاری بەجێدەهیشت بەڵام مامە حاجی بێئاگا بوو ، هەر بەخۆشی و جوانی و ناوبانگی نازو فیزی دەکرد وازی هێنا بوو لە فەرمانەکانی خوای گەورە نوێژ،ڕۆژوو ..هتد جاتاوەکو گەیشتە ئەم ڕۆژگارەی پیری و پەکەوتەی . بۆیە هەرکەس ویستی بە نمونە خۆشییەکانی دنیایی بۆڕوون بێتەوە بابچێتە لای ئەم مامە حاجیە کەمێ باسی حالی خۆی بۆبکات کەچەن خۆشی دیوە لەولامی مامە حاجی بۆت ، کوڕی خۆم : من وا ئێستا تەمەنم بۆ هەشتاکان دەڕوات بەڵام ئەو تەمەنەی بەڕیمکرد لەخۆشی و ڕابواردن هیچ نەبوو کەهەستی پێبکەی ساتێکی کەم نەبێ ئەویش هەموو ڕۆیشت ! ئێستاش واتێدام ناوەستێ دەڕوات ، بۆیە ئەی کوری شرینم وریابە ژیانی دنیا هەلت نەخەلەتێنت.ئەی کورە ژیرەکەم بزانە ئەوەی لای خوای گەوەرەیە باشتر و نەبڕاوەترە لەم ژیانەی دنیا ، ئەوەی دێتە دەستت لە مال ، پارە ، سەروەت ، ژن ، ناوبانگ ، جوانی ..هتد هەمووی دەڕوات .

(فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا) (36) الشورى . واتە: ئینجا هەر شتێك بە ئێوە بەخشراوە، لەزەت و بەهرەی ژیانی ئەم دونیایەو، زۆر بەزوویی ئەڕوات و نامێنێتەوە ،

بەڵێ ئەی کوڕەنازادارەکەم ئاگاداربە ئەوتەمەنە ناسکەت لەژیانی دنیا تەنها بۆ ڕەزامەندی خوا سەرفی بکە دڵنیابە خوای پەروەردگار باشترین شوێە پاداشتت دەداتەوە ،

(وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ) (36) الشورى . واتە:ئەو پاداشت و بەخشەش لای خوایە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، وە بە پەروەردگاریان پشت ئەستوورن ، باشتروو پایەدارترە. بەڵێ ئەی براو خوشکانی بەڕێزم باش بزانن ئەم ژیانەی دنیا لەچاو قیامەت هیچ نیە هەربۆیە ئەوکەسانەی پشتیان لەبەرنامەی خوا کردبوو ، غەرقی و هەواو هەوسیان ببون هەموو ئامانجیان ژیانی دنیا بوو ، لەقیامەت سوێند دەخۆن کەلەدنیا هیچ نەژیاون تەنها چەن سایکی کەم نەبێ .(وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَٰلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ)(55)الروم.واتە : ئەو ڕۆژەی کە قیامەت بەرپا دەبێت تاوانباران سوێند دەخۆن کە: بەدەرلەساتێك نەماونەتەوە لە دنیادا هەر ئاواش بوو لەدنیادا لا دەدران لە هەق، بۆ ناهەق و باتڵ.

بەڵێ لەژیان بوون ڕێگای خوای گەورەیان وونکردبو بەهۆی خۆشویستنی ژیانی دنیاو غافل بوون پێوە. مرۆڤ زۆر سەیرە هەموو هەوڵێکی تەنها

بۆ ژیانی دنیایە ، چونکە دنیا لەبەر دەستیەتی ژن ، سەیارە ، پارە ،خواردنی خۆش ..هتد لەهیچی کەم نیە . بۆیە هاتنی

قیامەت بەدوور دەزانێت کارو کردەوەی بۆ کۆناکاتەوە بەهۆی ڕابواردن و خۆشییەکان .

(إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا) (6)المعارج .واتە: بەڕاستی ئەوانە قیامەت بەدوور دەبینن بەدووری دەزانن. بەڵێ بەدووری دەزانێت دەڵێت بابۆخۆمان جارێک ڕابوێرین خۆدنیا خراپ نابێت تازە گەنجین ، کەچی لەڕاستیدا هاتنی قیامەت زۆرنزیکە .

(وَنَرَاهُ قَرِيبًا )(7)المعارج. واتە:ئێمەش، زۆر بەنزیکی دەزانین (چونکە خوا خۆی بەدیهێنەری کاتە). بەلام موسڵمانی ڕاستگۆ و شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەزانن ڕۆژێک دێت دەگەڕێنەوە بارەگای خوا بۆ لێ پرسینەوە لەو کارو کردەوەی کە کردوویانە. (فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ) (92)الحجر .واتە: سوێند بەپەروەردگارت ئەی موحەممەد! (ﷺ) لەهەمووان دەپرسین. بەڵێ بۆیە خەمی دنیای نەبوو وەک ئەمانەی تر کە قیامەتیان بەدوور دەزانی، دەیزانی پرسیار لەهەموو ئەو کارکردەوەی دەکرێ لەڕۆژی لەدایک بوونی تا دواساتی تەمەنی .

(عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ) (93)الحجر. واتە:لەو کاروکردەوەیە دەیانکرد. کەوایە با لەو ساتەوە بڕیاربدەین بادلەکانمان خاوێن بکەینەوە لە ژەنگی تاوان کەبۆتە هۆی تورەبوونی خوا لێمان ،

با خۆمان ڕادەستی خوا بکەین تاکو زووە لەژیانین ( وَأَنِيبُوا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ) (54)الزمر. واتە:هەوڵ بدەن هەمیشە و بەردەوام دڵتان لای خوابێت و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیمی ئەوبن . بەڵێ ئەی برایان و خوشکانم بالەو دنیایە وا نەکەین دلی شەیتان خۆش بکەین بەهۆی سەرپێ چی کردنی خوا ، با دایک و خوشکانمان فێری پەروەردەیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکەین با دڵ و نەفسی خۆمان لەگەل قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری نازدار(ﷺ) ئاشنا بکەین تا لەڕۆژی دوای خوای پەروەردگار بانگمان بکات بۆبەهەشت پێمان بفەرموێت من لێتان رازیم( ارْجِعِي إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً) [28]الفجر. واتە: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازیە ، بالەگەل بەندەکانی خوا بین ئەوانەی ژیانی دنیا یان کردە قوربانی ئاخیرەت بۆخوا ژیان ( فَادْخُلِي فِي عِبَادِي) (29 )الفجر واتە: دە بچۆرە ڕیزی بەندە چاکە نازدار و بەرێزەکانمەوە، دوای داخلی بەهەشتمان دەکات

(وَادْخُلِي جَنَّتِي) [30]الفجر. واتە : بچۆرە بەهەشتە خۆشە ڕازاوەکەمەوە. بائیمەش یەکێک بین لەوانە ئەی برایان و خوشکانم ئەگەر بزانن چونکە ئەوەی لای خوایە باشترە بۆ کۆتاییە . ئەوجا ئەی بەندەکانی خوا بالەئێستاوە مەردی خوابین ئەوتەمەنەی بەرێمان کردوە کە لەبێ فەرمانی خوا

## عبدالله خاکی ورِیابە ژیانی دنیا هەڵت نەخەڵەتینت

بەسەر مان بردووە با لەئێستاوە کە چەن سالێک تەمەن مان ماوە تامەرگ نەبۆتە میوان قەرەبووی بکەینەوە بەخوا پەرستی چونکە ژیان بەسەربردن یەکجارە جارێکی تر ناتوانی بگەڕێیەوە بۆ دونیا بۆیەئەم جارەش بکەین بە قوربانی رێگای خوا ، بۆخوا ژیان بکەینە ئامانج تا خوای پەروەردگار پێمان ببەخشێ خەلاتە نەبڕاوەکەی کەبەهەشتە

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين
وصلى الله على خير خلقه محمد وعلى آله وصحبه وسلم